# چۆن خێرایی خوێندنەوەت زیاد دەکەیت



نووسینی
فهد بن محمد الحمدان

وەرگێڕانی
دەشتی فهمی

2022

ناوی کتێب : چۆن خێرایی خوێندنەوەت زیاد دەکەیت

نووسینی : فهد بن محمد الحمدان

بابەت : گەشە پێدانی مرۆیی

وەرگێڕان لە عەرەبییەوە : دەشتی فهمی

ساڵ : 2022

# پێشەکی

## بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

**درود و سلاو لە پێغەمبەری خودا بێت**

**زۆرێك لە خەڵكی هەر بەوجۆرە دەژی کە ڕاهاتووە لە سەری. بێ ئامانج، بێ پلان، پاشاگەردانی و هەمان هەڵەی دووبارە. لەبەرئەوەیە کە ڕووبەڕووی تەنگژەی جۆراوجۆر دەبێتەوە، هەم لەگەڵ خۆی و هەمیش لەگەڵ دەوروبەرەکەی.**

**ئەمە وای لێ دەکات ژیان بە شپرزەیی بەڕێ بکات و کێشەکانیشی کەڵەکە ببن بەسەر یەکترەوە، ئەمەش هۆکاری دڵەڕاوکێ و هەست نەکردنە بە چێژی ژیان.**

**حەز بە هیچ هەوڵێك ناکات بۆ گۆڕینی واقیعی ژیانی خۆی. بگرە خۆی بەدەستەوە دەدات و تواناکانی فەرامۆش دەکات.**

**لەم زنجیرەیەدا هەوڵ دەدرێ خوێنەر پەی بە تواناکانی خۆی ببات و بیاندۆزێتەوە،**

**بەگوێرەی کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و لە ڕێگای چەند هەنگاوێکی دیاریکراو و کرداریدا گەشە بە خۆی بدات، بۆ ئەوەی بەرەو باشتر و بەرزتر و دڵخۆشی زیاتر بچێت.**

**زنجیرەکەمان ئەم بابەتانە لەخۆ دەگرێت :**

**باوەڕبەخۆبوون، چارەسەری کێشەکان، بەڕێوەبردنی کات، خوێندنەوەی خێرا، مامەڵەکردن لەگەڵ ئەوانیتر، هونەری بەڕێوەبردنی توڕەیی، سەرکەوتن لە خوێندن و هونەری وتاردان.**

**ئێمە هەموومان لەدوای دۆزینەوەی تواناکانمان و کارپێکردنی، پێویستمان بە برەودان بە تواناکانمان هەیە بۆ ئەوەی ژیانمان جوانتر بکەین.**

**ئەم هەوڵەی لەم زنجیرەیەدا دەدرێ، کۆی خوێندنەوەیەکی فراوانە لەگەڵ پرۆگرامە ڕاهێنانیەکان کە هەندێکیانم ئامادە کردبوو و، هەندێکیشیانم پێشکەش کردبوو، پێش ئەوەی بەشداربووان سوودی لێ ببینن، من خۆم سوودم لێ بینیوە.**

هەوڵمداوە خۆم بەدوور بگرم لە بیردۆز و دەربڕینە نادیار و چیرۆکە بیانیەکان. بەڵکو بەوەندە وازمان هێناوە کە دەربڕینەکان ڕوون و ئاشکرا بن و نزیك بن لە ژیانی ڕاستەقینەی خەڵك و ژینگەکەی.

حەزدەکەم ئەوە وەبیر خوێنەر بهێنمەوە کە گەیاندنی ئەو سوودانەی لەم زنجیرەیەدا وەدەستتهێناوە، لە تۆوە بۆ خەڵکیتر وهەروەها جێبەجێکردنی کرداریانەی بابەتەکانیش زۆر گرنگە، بەڵکو تەواوکەری سوودەکەیەتی.

جا ئەگەر بە حەزێکی ڕاستەقینە و، بۆ گۆڕانکاری نەیخوێنیتەوە، ئەوا سوودەکەی سنووردار دەبێ و دوای ماوەیەکی کورت زانیاریەکانی ناوی بەفیڕۆ دەچێت.

لەم زنجیرەیەدا و لەم کتێبەدا کە بە ناونیشانی ( چۆن خێرایی خوێندنەوەت زیاد دەکەیت )ە.

داوا لە خوای گەورە دەکەم، ئەم کارەم بە دڵێکی پاکەوە لێ وەرگرێ و هۆکارێك بێت بۆ گۆڕینی ژیانی خوێنەر بەرەو باشتر.

# سەرەتا

**بۆچی گەلێك جار ناتوانی كتێبێك بەتەواوی بخوێنیتەوە ؟**

**چونكە گرفتاری بەدەست بیٚ ئاگایی و كەم سەرنجی و تەنگژەیی و بێزاری.. هتد، وە بەهۆی شارەزا نەبوون بە هۆكارەكانی خوێندنەوەی خێراوە؟**

**ئایا دەزانی هێز و توانای ئەقڵت چەندە مەزنە؟**

**قەبارەی ئەو زانیاریانەی كە مێشكت هەڵیدەگریٚ بە ملیۆن ملیۆن جار گەورەترە لە خێراترین ئامێری كۆمپیوتەر كە $10^{79}$ زانیاریە، لەكاتێكدا قەبارەی خێراترین ئامێری كۆمپیوتەر بریتیە لە $10^{12}$ زانیاری.**

**خوێندنەوەش وەك هەر بەهرەیەكیتر پێویستی بە فێربوونە بە تامەزرۆییەوە.**

**ناكریٚ تۆ خوێندنەوەت خۆش نەویٚ و بشخوێنیتەوە. سەرەتا دەبیٚ گرنگی خوێندنەوە بۆ خۆت بزانی. بەڵام چێژ بینین لێی دەكەوێتە سەر كات و (ژەمە سوكەكان) ی سەرەتا.**

**خوێندنەوە وەك هەڵگەڕانە بەسەر شاخدا. سەرەتاكەی قورسە بەڵام دوای سەركەوتن بەسەر چەند شاخێكدا لەلات ئاسان دەبیٚ. بۆیە دەبیٚ لە هەڵبژاردنی شاخەكاندا پلە بەپلە بڕۆیت تاكو سەركەوتنت بەسەریدا ئاسان دەبیٚ لە سەرەتادا.**

**جا خوێندنەوەی تازە وەكو منداڵێكی تازە لەدایك بوو وایە كە پێویستی بە ژەمە خواردنێكی سادە هەیە وەك پێشەكی، ئینجا بەرەو خواردنی چەور .**

**ئەو كەسەی چێژ لە یاریەكان وەردەگریٚ سەرەتا بە یەك دوو یاری چێژی لیٚ نەبینیووە، بەڵكو چەند یاریەكی زۆری سەیر كردووە و یاسا و ڕێساكانی یاری شارەزا بووە لەگەڵ بەهرەی یاریزانەكان.**

**تۆش بە خوێندنەوەی یەك یان دوو كتێب چێژ وەرناگری، بەڵكو دوای خوێندنەوەی كۆمەڵە كتێبێكی گونجاو دەبێت كە نووسەرەكانیان وەكو ( هەنگ ) دەگەڕێن بەسەر هەزارەها گوڵدا و شلەكانیان هەڵدەمژن بۆ بەرهەمەكەی كە دەبینریٚ.**

دڵنیابە لەوەی کە بە زۆر خوێندنەوە بەرهەمی زمانەوانیت زیاد دەبێ، کە یارمەتیت دەدا قسەکردنت لەگەڵ خەڵکیتر ڕوون و ڕەوان و ڕێکوپێك بێت.

دەست بە خوێندنەوەی ئەو جۆرە کتێبە بکە کە حەزت بۆی هەیە. چونکە تۆ هەر کەسێکت خۆش نەوێ ناتوانی هاوڕێیەتی بکەی .

لەمڕۆ بەدواوە خۆت ناچار بە خوێندنەوەی خێرا بکە .

هەموو ئەو شتانەی دەیخوێنیتەوە لێیان تێناگەی بەڵام بە ڕاهێنانی ڕۆژانە زوو فێر دەبی. بیرۆکەکانت بەشێوەیەکی دڵڕفێن کۆدەکەیتەوە.

لە سەرەتاکاندا هەڵە ڕوودەدات بەڵام ئەوە شتێکی ئاساییە لەو کاتانەدا. جا بۆیە زۆر گرنگی بەم هەڵانە مەدە و لە ڕاهێنان بەردەوامبە.

بابەتێك بەخێرایی بخوێنەوە بۆ ٢-٣ جار ئەگەر پێویستی کرد. ئەوەش بۆ وەرگرتنی بیرۆکە سەرەکیەکان. دوای ئەوە بۆ وەستان لەسەر وردەکاریەکان بە وردی بخوێنەوە.

ئایا دەزانی ڕێژەی گشتی (خێرایی خوێندنەوە) لە نیشتمانی عەرەبی لەنێوان ١٥٠ - ١٧٠ وشەیە لە خولەکێکدا؟

وە ئاستی تێگەیشتنیش لەنێوان ٤٥٪ - ٥٥٪ ە بەگشتی؟

جا ئەگەر کاتی تایبەت بە خوێندنەوەی ڕۆژانە تەنها یەك کاتژمێر بێ ئەوا تۆ پێویستیت بە ٢ هەفتە دەبێ بۆ ئەوەی کتێبێکی ٣٠٠ لاپەڕەیی بخوێنیتەوە. بەڵام ئەگەر خێرایی خوێندنەوەت زیاد بکەی لەگەڵ ئاستی تێگەیشتن و هێزی یادەوەریت ئەوا دەتوانی بەهەمان کات لەنێوان ٢-٣ ڕۆژدا کتێبێك تەواو بکەی.

با بڵێین تۆ هەموو هەفتەیەك کتێب دەخوێنیتەوە و هەفتانە تەنها سوودێك و بەهرەیەك وەردەگری بەلایەنی کەمەوە. جا بێنە بەرچاوت لەماوەی ساڵێکدا بەکوێ دەگەیت ؟

ڕۆشنبیری و زانیاریت زیاد دەکات و ئاسۆی بیرت فراوان دەبێ و پلەوپایەت بەرز دەبێتەوە.

ئەگەر ٢ هاوڕێ هەبن، کە یەکێکیان لە یەکێکیتر خێرایی زیاتر بێ ئەوا خوێنەرە خێراکە بێزار دەبێ لە چاوەڕوان کردنی هاوڕێکەی تاکو دەگاتە . دەبینی کە خۆی بە هەندێ شتی لاوەکیەوە خەریك کردووە کە هیچ پەیوەندی بە پێشبڕکێکەوە نیە.

لەکاتی چاوەڕوانکردنی هاوڕێکەیدا سەرنجی لەسەر پێشبڕکێکە پەرش وبلاّو دەبێ و پەرۆشی تەواو کردنی پێشبڕکێکەی کەم دەبێتەوە.

ئەمە ڕێك وەکو پێشبركێی نێوان ئەقلّ و چاوە، کە ئەقلّ خێراییەکەی (١٠٠٠٠کم)ە لە خولەکێکدا و چاویش هێواشە لە خوێندنەوەدا.

جا هەر کاتێك خێرایی خوێندنەوەت زیاد بوو ئەوا تێگەیشتنت بۆ بابەتەکە زیاتر دەبێ.

با ئامانجەکەت بەلایەنی کەمەوە گەیشتن بێ بە سێ هێندە کردنی خێرایی خوێندنەوت لەگەڵ ئێستادا.

وێنای ئەوە بکە کە ئەم خێراییە لەسەر دەستی ڕاستت نەخشێنراوە بە پیتی دیار و درەوشاوە کە بۆنێکی خۆش و جوانی هەیە و دەدرەوشێتەوە، دەستی چەپیشت دەخەیتە سەری و پەیمانی ئەوەی پێ دەدەی بگەیتە ئەو خێراییە.

جا بەردەوامبە لە خوێندنەوە ( ٤٥ خولەك بۆ ماوەی ٢١ ڕۆژ ) بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەت.

کاتێك فێری خێرا خوێندنەوە دەبی حەزت زیاد دەبێ بۆ کتێبەکانی ناو کتێبخانەکەت. بەجۆرێك کەوا هیچ کتێبێك ناهێڵێتەوە بەبێ خوێندنەوە.

## ئەزموونی خوێنەرێك :

سوپاس بۆ خودا، درود و سلاّو لە پێغەمبەری خودا :

من سوودم لە وتاری پێشەوایەك وەرگرت ( خوا لێی ڕازی بێت ) .

سوودێکی جوان کە لە چاوەکانمدا هەڵم گرتووە. لە کاتی بەرنامەی خوێندنەوەدا ئەویش بریتیە لە :

باشترین ئەو شتەی گوێبیستی بووی بینووسەوە، وە باشترین ئەو شتەی نووسیوتەوە لەبەری بکە، وە بە باشترینی ئەو شتەی لەبەرت کردووە قسە بکە.

بەرنامەی خوێندنەوەی من لەکاتێکەوە بۆ کاتێکیتر و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتریش جیاوازە. وە بەگوێرەی دانیشتن و گەشتەکان و جیاوازی لە کردار و بیرۆکەکاندا. ئەوەش ئەزموونێکی لاوازە بەهۆی کەمتەرخەمی خاوەنەکەی و لاوازی نووسەرەکەیەوە. بەڵام بەکورتی و پوختی لەم خاڵانەدا ڕوونی دەکەمەوە :

١. هەوڵ دەدەم کتێبەکە یاخود بەرگەکان تەواو بکەم. چونکە تەواوکردنی دەبێتە هۆی هاندانی دەروون و پەرۆشی و حەزی زیاتری کتێبێکیتر.

٢.زیاتر لە هونەرێك دەخوێنمەوە تاكو لە دەروونی بێزار و نیگەران ڕزگارم بێت.

٣.حەزم بە خوێندنەوەی تەواو و تۆكمە هەیە، وەهەروەها لەگەڵ هەر كتێبێكدا سوودەكانی دەنووسمەوە و باشترین شتەكانی تۆمار دەكەم. وە چەندبارەی دەكەمەوە تاكو بەتەواوی لێی تێدەگەم و لەبەری دەكەم.

٤. سوودەكانی كتێب لە كۆڕ و كۆبوونەوەكاندا وەبیر خۆم دەهێنمەوە و لەگەڵ هاوڕێیان و خێزاندا باسیان دەكەم تاكو پەیوەستیەك لەنێوانیاندا دروست دەكەم.

٥. ئەو كتێبانەی دەربارەی زانست و هونەر و شتیترن لەلایەن كەسانی تایبەتمەند و خاوەن ئەزموونەكانەوە هەڵدەبژێرم دوای ڕاوێژ كردن لەگەڵیان.

٦.سورم لەسەر خوێندنەوەی هەموو كتێبێك جا نووسەرەكەی هەر كەسێك بێت، تەنانەت ئەگەر هاوڕاش نەبووم لەگەڵ بیروڕاكانیدا.

ئینجا ئێمە لەسەردەمی كتێب زۆریدا دەژین كە هەمەجۆرن لە هونەرەكان و بیری و زانیاری گشتی و بواری تایبەتی.

لەسەر خوێنەر پێویستە هەڵبژاردنی كتێبەكانی باشتر بكات و كاتەكانی بەكاربێنێ. كەس ناتوانێ لەم سەردەمەدا بەهەموو كتێبێك ڕابگات. وەك شاعیر دەڵێ :

ما حوى العلم جميعا      لا و لو مارسه ألف سنة

إنما العلم كبحر زاخر      فاتخذ من كل علم احسنه

لێرەدا شاعیر باسی ئەوە دەكات كە ئەگەر ئێمەی مرۆڤ بۆ ماوەی هەزارساڵیش بە زانست و زانیاریەوە خەریك بین هێشتا تەواو نابێ چونكە زانست وەكو دەریایە و هەرگیز تەواو نابێت. بەڵكو پێویستە ئێمە لە هەر زانستە و شتێكی باشی لێوە فێربین. خوداش زاناترە و زانست و زانیاریش هەر بۆ ئەوە.

درودو سلاو لە پێغەمبەری خودا بێ و لە یارو یاوەر و شوێنكەوتووانی . سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار.

# بەشی یەکەم

## بۆچی دەخوێنینەوە

### ئێمە بۆیە دەخوێنینەوە چونکە خوێندنەوە :

### ١. پەرستشە :

خوێندنەوە یەکەم شتێکە کە خوای گەورە فەرمان بە پێغەمبەر و ئوممەتەکەی دەکات. کە بە وشەی ( بخوێنەوە ) فەرمانی پێدەکات لە ئەشکەوتەکەدا. لەکاتێکدا کە ئەو خوێندەواری نەبوو، خوداش زاناترە بەوە بەڵام وەك ئاگادارکردنەوەیەك لەلایەن خوای گەورەوە کە خوێندنەوە یەکێکە لە گرنگترین و یەکەمین ئەرکەکان لەم ژیانەدا. زانست وزانیاریش بەدی نایەت تەنها بە خوێندنەوەوە نەبێت.

### ٢. پردی پەیوەندیەکانی ئێستا و ڕابردووە:

ئێمە ژیانی گەلان و هۆز و تیرەکانی پێشین بۆ جیلی ئێستا دەخوێنینەوە تاکو بەهۆی ئەزموون و شارەزاییەکانی ئەوانەوە سوود وەرگرین بەبێ ماموستا. وەهەروەها پەرە بە بیرەکانیان بدەین بۆ گونجاندنی واقیعی ئێستامان.

### ٣. کلیلی زانستە :

هەموو زانستێك ڕێگای تایبەتی خۆی هەیە چ ئێستا و چ کۆنیش. ئێمە بۆ ئەوەی بگەینە ڕێژەیەکی بەرزی زانیاری دەخوێنینەوە، چا ٧٠٪ی ئەو شتانەی فێریان دەبین لە ڕێگای خوێندنەوەوەیە. وە دەخوێنینەوە بۆ ئەوەی ژیانمان ڕووناك بکەینەوە، بۆ ئەوەی ئەقڵمان چالاك بکەین، وە بۆ گەیشتن بە ڕاستیە شاراوەکانی ژیانمان.

### ٤. فراوانکردنی زانین :

ئەو کەسەی دەخوێنێتەوە وەك ئەو کەسە نیە کە ناخوێنێتەوە. ئەوەی دەخوێنێتەوە زانیاری زیاترە و ڕەفتار و گوفتاری باشترە و بیرکردنەوەی جوانترە لە کەسانیتر. ئەو کەسە لە چوارچێوەی کۆمەڵگاکەی دەردەچێت و جیهان دەناسێت، هەست و زانینەکانی تەنیا لە وڵات و نیشتمانەکەیدا گیر قەتیس نابێت.

خوێنەر، ئەقڵەکانیتری جیهان دەخاتە سەر ئەقڵی خۆی و سودی لێ دەبینێت. هەر کەسێك کتێبێکی نووسیبێت، ئەوا شتە جوانەکانی ناوی دەخاتە سەربار و سودی لێ وەردەگرێت.

### ٥.بیری دڵڕفین :

ئەمەش لەوەی پێشتر نزیکە، خوێندنەوە چالاکیەکی کارلێککردنە. مرۆڤ پێی هۆشیارتر دەبێ و بەرزتر دەبێتەوە. وە بەهۆی بیریەوە یارمەتی کەسانیتر دەدات لە چارەسەرکردنی کێشەکانیان. لە پێشترینی ئەوانەیە کە بە ڕاستیەکان دەگەن.

خوێندنەوە یارمەتی بەهرەی گفتوگۆ کردنت دەدات، یارمەتیت دەدات کە چارەسەری کێشەی خۆت و خەڵکانیتری پێ بکەی، دەتکاتە گەڕیدەیەکی چێژوەرگر و کاریگەر بووی جیهان.

بخوێنەوە، دانایيت زیاتر دەبێ.

### ٦.پەروەردەکردنی دەروونە :

دەخوێنینەوە تاکو ڕەوشتەکانمان جوان بکەین، وە جیاوازی نێوان هاوڕێی ڕاستەقینە و هاوڕێی درۆیینە بکەین. وە دەخوێنینەوە بۆ ئەوەی پەروەردەی دەروونمان بکەین لەسەر زیاتر ئارام گرتن و بەرگەگرتن، بەهۆی خوێندنەوەی ژیاننامەی گەورەکانی پێش خۆمان و پیاو چاکانەوە سوود لە ( پەرستش و هەوڵ و تێکۆشانەکانیان و ئارامگرتنیان لەسەر بانگەواز ) وەردەگرین و دەیانکەینە سەرمەشقی ژیانمان.

### ٧.دەستە و گروپی پێشکەوتنی جیهانی:

دەخوێنینەوە تاکو بزانین جیهان بەکوێ گەیشتووە. نابێ سەیر بکەین کە ژیانمان بەهێواشی بڕوات و بمێنێتەوە، وە نەشزانین و نەبینین کە خەڵکانیتر بەکوێ گەیشتوون.

ئەوان بە دوايين پێشکەوتنەکان بگەن و ئێمەش هەر بینەر بین. دەبێ بخوێنینەوە و بزانین بارودۆخ و سیاسەتی ولاتانیتر چۆنە. دەبێ لە باشەکانیان وەرگرین و ئەوانیتر واز لێ بێنین.

جا لەدوای خوێندنەوەی گرنگترین هۆیەکانی خوێندنەوە بۆ ژیانمان و زانیمان کە بۆچی دەخوێنینەوە، ئێستا فەرموون لەگەڵ هەندێك ڕاستی سەرسوڕهێنەر :

### تەقینەوەی زانیاری لە جیهاندا :

*تەنها یەك چاپی ڕۆژنامەی (نیویۆرك تایمز) زیاترە لەو زانیاریانەی کە کەسێکی سەدەی شەشەم بەدرێژایی تەمەنی فێری ببوو.

*ڕۆژانە ٧٠٠٠ توێژینەوەی زانستی دەردەچێت لە سەرانسەری جیهاندا.

*هەر ئێستا ١٠٠٠٠ گۆڤار بە تەنها لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەردەچێ.

*سالأنە ٥٠٠٠٠ کتێب لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەردەچێ.

*هەموو ٥ ساڵێك ڕێژەی زانیاریەکان دوو هێندە دەبنەوە.

## کاتە گونجاوەکان بۆ خوێندنەوە :

کاتێك دابنێ بۆ خوێندنەوە کە ئاسودە بیت تیایدا. وەهەروەها کاتەکانی چاوەڕوانیت بە هەل بزانە بۆ خوێندنەوە. ئەوەش بە هەڵگرتنی کتێبێك لەگەڵ خۆت بۆ هەر کوێیەك بێ. جا دەبینی کە چۆن سەرت دەسوڕمێ لە زۆری ژمارەی ئەو لاپەڕانەی خوێندووتەتەوە.

## تێگەیشتنە هەڵەکان لەسەر خوێندنەوە :

١.بۆ ئەوەی زیاتر تێبگەی، پێویستە بەهێواشی و چاودێریەوە بخوێنیتەوە.

٢.خوێندنەوەی (ووشە بە ووشە) یارمەتی تێگەیشتنت دەدات.

٣. دەبێ ١٠٠٪ ئەو شتانەی دەیخوێنیتەوە تێبگەیت.

٤.دەبێ ١٠٠٪ هەموو ئەو شتانەی دەیخوێنیتەوە بەبیرت بێنەوە.

٥.کاتێك هەست دەکەی کە ووشەیەك یاخود بابەتێك تێناگەی دەبێ دووبارە بچیتەوە سەری و بەردەوام نەبی لە خویندنەوەکەت.

٦.پێویستە لاپەڕە بە لاپەڕە بخوێنیتەوە، نابێ لاپەڕەی (٢٠) پێشی لاپەڕەی (١٩) بخوێنیتەوە.

٧.قسەکردن لەکاتی خوێندنەوەدا خووی کەسە تەمبەڵەکانە و دەبێ وازی لێ بهێنرێ.

٨.بیروباوەڕی ناوەکیت هیچ کار لە تێگەیشتن و خێرایی خوێندنەوەت ناکات.

٩.کاتێك دەگەیتە ووشەیەك كە ماناكەی نازانی، پێویستە فەرهەنگی وشەکان بێنیت و ماناكەی تێبگەی پێش ئەوەی بەردەوامی بدەی بە خوێندنەوە.

١٠.یەکێك لە مەترسیەكانی خوێندنەوەی خێرا بریتیە لە كەم بوونەوەی ئاستی تێگەیشتن.

١١.هەموومان بە خێراییەکی ئاسایی و سروشتی دەخوێنینەوە.

# بەشی دووەم

## چۆنیەتی هەژمارکردنی خێرایی خوێندنەوەی سەرەتاییت

بەشێکی کتێبێك هەڵبژێرە بۆ تاقیکردنەوەی خێرایی خوێندنەوەت. پاشان بەشێوەی پارچە پارچە بیخوێنەوە، بەمەرجێك کە پێشتر نەتخوێندبێتەوە.

١. لەماوەی ٣ خولەکدا ئەم بەشە بخوێنەوە، بەوپەڕی خێراییەوە و بەبێ ئەوەی سەیری کاتژمێرەکەت بکەی یان بەبێ بەکارهێنانی کاتدانەرەوەکەت.

٢. دوای تەواوبوونی ٣ خولەکەکە نیشانەیەك لەسەر بابەتەکە دابنێ لەو شوێنەی لێی وەستاوی.

٣. بە وردیەوە ڕێژەی مامناوەندی ژمارەی ووشەکانی ڕیزێك هەژمار بکە. بەهۆی ژماردنی ژمارەی ووشەکانی ٦ ڕیزی تەواو و پاشان دابەشکردنی بەسەر ٦دا.

ناوەندی ژمارەی ووشەکانی ڕیزێك = .....وشە.

٤. ژمارەی ڕیزە خوێندراوەکانت بلّی، وە لەکاتی تێپەڕینی ڕیزێکی تەواونەکراودا دەبێ لەگەڵ یەکێکیتری وەك ئەودا هەژمار بکەی، واتا بە٢ دانە یەك ڕیز هەژمار دەکرێ.

٥. ژمارەی هەموو ڕیزە خوێندراوەکانت لێکدانی ژمارەی مامناوەندی ووشەکان بکە.

٦. ئەنجامی هەنگاوەکەی پێشتر دابەشی سەر خولەکەکان بکە کە خوێندنەوەکەت خایاندوویەتی

( لەپێشتردا بە٣ خولەك دیاری کرابوو).

پاشان ئەنجامەکەی دەکاتە ڕێژەی ووشە خوێندراوەکانت لە خولەکێکدا. بەپێی ئەم یاسایە :

خێرایی خوێندنەوە = ژمارەی ووشە خوێندراوەکان / کاتی خوێندنەوە (وشە/خولەك).

پێویستە کاتی خوێندنەوە بەپێی ئەم خشتەیەی خوارەوە بگۆڕدریٚ :

## خشتەی چاککردنی کات

| چرکە | گۆڕین | چرکە | گۆڕین | چرکە | گۆڕین | چرکە | گۆڕین |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | 0.01 | 16 | 0.26 | 31 | 0.51 | 46 | 0.76 |
| 2 | 0.03 | 17 | 0.28 | 32 | 0.53 | 47 | 0.78 |
| 3 | 0.05 | 18 | 0.30 | 33 | 0.55 | 48 | 0.80 |
| 4 | 0.06 | 19 | 0.31 | 34 | 0.56 | 49 | 0.81 |
| 5 | 0.08 | 20 | 0.33 | 35 | 0.58 | 50 | 0.83 |
| 6 | 0.10 | 21 | 0.35 | 36 | 0.60 | 51 | 0.85 |
| 7 | 0.11 | 22 | 0.36 | 37 | 0.61 | 52 | 0.86 |
| 8 | 0.13 | 23 | 0.38 | 38 | 0.63 | 53 | 0.88 |
| 9 | 0.15 | 24 | 0.40 | 39 | 0.65 | 54 | 0.90 |
| 10 | 0.16 | 25 | 0.41 | 40 | 0.66 | 55 | 0.91 |
| 11 | 0.18 | 26 | 0.43 | 41 | 0.68 | 56 | 0.93 |
| 12 | 0.20 | 27 | 0.45 | 42 | 0.70 | 57 | 0.95 |
| 13 | 0.21 | 28 | 0.46 | 43 | 0.71 | 58 | 0.96 |
| 14 | 0.23 | 29 | 0.48 | 44 | 0.73 | 59 | 0.98 |
| 15 | 0.25 | 30 | 0.50 | 45 | 0.75 | 60 | 1.00 |

دوای هەژمارکردنی خێرایی سەرەتایی خوێندنەوەت، بچۆرە سەر ئەو قۆناغەی کە لەبەشی داهاتوودا گفتوگۆی لەبارەوە دەکەین بۆ زیاد کردنی خێرایی خوێندنەوەت.

# بەشی سێیەم

# چۆن خێرایی خوێندنەوەت زیاد دەکەی

**ڕێژەکانی خێرایی لە خوێندنەوەدا :**

| ڕێژەی خێرایی لە خوێندنەوەدا | باس کردن |
|---|---|
| کەمتر لە ١٢٠ ووشە لە خولەکێکدا | خێرایی خوێندنەوەت زۆر کەمترە لەو ڕێژە مامناوەندیەی خوێنەرێکی ئاسایی |
| لە ١٢٠-١٨٠ ووشە لە خولەکێکدا | خێرایی خوێندنەوەت زۆر کەمترە لەو ڕێژە مامناوەندیەی خوێنەرێکی ئاسایی |
| لە ١٨٠-٢٤٠ ووشە لە خولەکێکدا | خێرایی خوێندنەوەت مامناوەندە |
| لە ٢٤٠-٣٥٠ ووشە لە خولەکێکدا | خێرایی خوێندنەوەت ڕێژەکەی زیاترە لەو ڕێژە مامناوەندیەی خوێنەرێکی ئاسایی |
| لە ٣٥٠-٥٠٠ ووشە لە خولەکێکدا | خێرایی خوێندنەوەت زۆر باشە |
| زیاتر لە ٥٠٠ ووشە لە خولەکێکدا | خێرایی خوێندنەوەت نایابە |

## تێبینی /

هەست بە نائومێدی مەکە ئەگەر خوێنەرێکی خێرا نیت، دەتوانی بەکەمێك ڕاهێنان خێراییەکەت زیاد بکەی. ئەوەشت لەبیر نەچێ کەوا ئەو کەسانەی ڕاهاتوون لەگەڵ خێرا خوێندنەوەدا ئەوانیش بە گوێرەی ئامانجەکانی خوێندنەوە خیراییەکەیان دەگۆڕن. ئینجا خوێندنەوەی بابەتێکی ڕۆژنامە وەکو خوێندنەوەی کتێبێك نیە.

ئەوانەی دواتر هەندێك هەنگاوی کردارین کە یارمەتی خێرا خوێندنەوەت دەدات لەگەڵ ڕاددەی تێگەیشتن لە خوێندنەوەدا.

## زەمینە سازکردن

### جەستەیی و دەروونی :

*دەبێ لە کاتێکدا بخوێنینەوە کە تیایدا جەستە و دەروونمان هەست بە ئاسودەیی بکات. ئەوە هەڵەیەکی زەقە کە لەکاتی ماندووبوون و هەوڵ و تێکۆشاندا بخوێنینەوە، یاخود بە بارودۆخێکی دەروونی ناخۆشدا تێپەر ببین.

*دەبێ پێش خوێندنەوە ئامانجەکەمان دیاری بکەین بۆ ئەوەی هیچ بێزاریەکت توش نەبێ کە وات لێبکات واز لە خوێندنەوەی کتێبەکە بهێنی ئەوەش بەوە دەبێ کە ئەم پرسیارە لەخۆت بکەی :

ئایا من ئەم کتێبە بۆچی دەخوێنمەوە؟

سوودی خوێندنەوەی ئەم کتێبە چیە کە تەواوم کرد؟

ئەمە لە دەفتەرێکی یاداشتدا بنووسە و دوای تەواوبوونی خوێندنەوەکەت پێیدا بچۆرەوە.

### *سەرقاڵ نەبوون :

ئەو شوێنانەی پڕ سەرقاڵین بەجێی بهێڵە. لە تەنیشت تەلەفزیۆنەوە مەخوێنەوە، یان لە شوێنێك کە زۆر پەستت دەکات، چونکە ئەمە کاردەکاتە سەر ڕێژەی تێگەیشتن و کەم سەرنجیت. ئەمەش دەبێتە هۆی پچڕان لە خوێندنەوە و کەمێك سەرقاڵ بوون.

### *ڕوناکیەکی گونجاو :

نە زۆر کز و نە زۆر ڕۆشنیش بێت. بەڵکو مامناوەند بێت، ڕاستەوخۆش نەکەوێتە سەر کتێبەکە چونکە چاومان ماندوو دەکات.

### *پلەیەکی گەرمی گونجاو :

شتێکی سروشتیە کە تێنەگەین لە خوێندنەوەدا لە کەشێکی زۆر سارد یاخود زۆر گەرم.

***کتێبەکە بەشێوەیەکی ڕاست و دروست دابنێ:**

**با لەڕێکی مێزەکەت بێت (ئەگەر مێز بوو)، با لاپەڕەکانی ڕاست بێ(بەدەست ڕێکی بخە).**

**من هەندێك خوێندکارم زۆر بەدڵە کە کتێبەکانیان لە بەرگ دەگرن و پەتێکیش دەکەنە ناوی کە هەڵدانەوەی لاپەڕەکان ئاسان دەکات.**

***دانیشتن بەشێوەیەکی درووست :**

**دەبێ جەستە ڕێك و ڕاست بێ و سەریشت هاوسەنگ بێت لەگەڵ پشت بە ڕێکی. خوار وخێچ نەبێ بەرەو پێشەوە، هەروەها ملیشت خوار نەبێ، دەستەکانیش گۆشەیەکی ڕاست دروست بکەن لەگەڵ ئاستی پشت، پێیەکانیش لەگەڵ ڕێکی زەویدا دابنرێ، ئەمەش بۆ دەستەبەر کردنی ئاسودەییەکی زیاتر.**



## هەنگاوەکانی خوێندنەوەی خێرا :

**دوای زەمینەسازی، ئێستا ئێمە ئامادەین بۆ خوێندنەوە.**

**پێش دەست کردن بە خوێندنەوە، هەندێك کارامەیی هەیە کە یارمەتیدەرمانە تا بەشێوەیەکی دروست بخوێنینەوە. چونکە خێرایی پەیوەستە بە تێگەیشتنەوە، ئەگەر نا پێویست بەوە ناکات :**

**یەکەم / خوێندنەوەی بێ دەنگ :**

ئەم جۆرە خوێندنەوەیە بریتیە لە دەرنەبڕینی ووشە. گەورەترین هەڵە ئەوەیە کە ووشەکان بخوێنینەوە لە ناخماندا وەك ئەوەی لە ساڵانی پێشووتردا فێری بووین. جا بۆ ئەوەی بتوانی بەبێ دەنگی بخوێنیتەوە دەتوانی پارچەیەك شیرینی یاخود سیواکێك لەدەمت وەردەی یاخود زمانت بەرەو مەلاشوت بەرز بکەیتەوە یاخود ئەوە بێنە خەیاڵی خۆت کەوا دەنگی ناوەوەت بەهۆی کۆنترۆڵێکەوە کەم دەکەی، بە ژماردنی ١٠–١.

ئێمە وادەزانین کە ئەوە چاوەکانن دەخوێننەوە، کەچی لە ڕاستیدا ئەوە (ئەقڵ)ە دەخوێنێتەوە. ئێستا ڕاهاتووین کەوا بەبێ دەنگیەوە بخوێنینەوە، یاخود بە دەنگی ئەقڵیمان بخوێنینەوە. بەجۆرێك خوێنەر هەست دەکات کە ووشەکانی لە ئەقڵیدا حونجە دەکات. ئەم شێوازەش ڕووبەڕوو بوونەوەمانە لەگەڵ خێرایی.

ئێمە پێش ئەوەی لێکدانەوە بۆ ئەو ووشەیە بکەین کە بە چاوەکانمان دەیگرین و دواتر دەیگەڕێنینەوە بۆ ئەوەی بیخوێنینەوە بە دەنگێکی سرت و لاواز. یان لە زەینماندا پاشان گوێی لێ دەگرین. لەکۆتاییدا هەڵدەستین بە ڕوونکردنەوەی مانای ئەو ووشەیەی کە خوێندوومانەتەوە، ئەمەش ڕێگایەکی دوورو درێژە.

خەیاڵی ئەوە بکە کەوا دوو هاوڕێ پێشبڕکێ دەکەن:

یەکێکیان زۆر خێرایە لەویتر، پێشبڕکێکارە خێراکە بێزار دەبێ لە چاوەڕوان کردنی هاوڕێکەی تاکو دەگاتە لای. بۆیە خۆی سەرقاڵ دەکات بەهەندێ شتی لاوەکیەوە کە هیچ پەیوەندی بە پێشبڕکێکەوە نیە لەکاتی پێشبرکێکەدا.

بەم جۆرە بیرو هۆشی پەرشوبلاو دەبێتەوە و حەزی تەواوکردنی پێشبرکێکەی کەم دەبێتەوە. ئەوەش وەك پێشبڕکێیەکە لەنێوان ئەقڵێکی بیرکەرەوەی زۆر خێرا کە ( ١٠٠٠٠ وشە/خولەك)دا و چاوێکی هێواش لە خوێندنەوەدا کە ڕێگا خۆش دەکات بۆ ئەقڵ تاکو سەرقاڵ بێت بە بیرکردنەوەی ئەو شتانەی هیچ پەیوەندیەکی بە خوێندنەوەوە نیە.

لەبەر ئەوە هەر کاتێك خێرایی خوێندنەوەت زیاتر بێت ڕێژەی تێگەیشتنیشت بۆ بابەتەکە زیاتر دەبێ و ئاستی تێگەیشتنت زیاتر دەبێ. لەکاتێکدا پێشتر دەبوایە بە چاوەکانمان ووشەکەمان بینیبا ئەوسا ڕاستەوخۆ ماناکەیمان لێك بدایەتەوە، هەروەك چۆن لێکدانەوە بۆ وێنەیەك دەکەین.

ئێمە پێویستمان بەوەیە کە توانا سەرسوڕهێنەرەکانی ئەقڵ و چاو بناسین، بەشێوەیەکی نموونەیی ئاڕاستەیان بکەین.

## دووەم / جولاَندنی پەنجە :

ئەوەش بریتیە لە تێپەڕاندنی پەنجە (باشترین شتە)، یاخود قەڵەمێك لەژێر ڕیزەکاندا بەشێوەیەکی زنجیرەیی.

پەنجەت لەژێر ڕیزەکە دابنیَ، دوای دەستپێکردنی بە دوو ووشە. ئینجا پێش ئەوەی دوو ووشەت بمێنیَ بۆ تەواوکردنی پەنجەت لابەرە.

ئامانج لەو شتەدا ڕێگریکردنە لەچاو بۆ وەستان بەبیَ ئەوەی سەر بجولَیَ، کە ئەمەش یارمەتیدەرە بۆ :

*سەرنجدان لە ووشە گرنگەکان، وە خۆ پاراستن لە بۆشاییە بێزارکەرەکان.

*بەرەوپێشچوون و ڕێگریکردن لە گەڕانەوە بۆ دواوە لەکاتی خوێندنەوەدا.

بەم جۆرە ناچارت دەکات کە بە ڕێژەیەکی بەرزتر لە خێرایی قسەکردندا بخوێنیتەوە.

ڕێگات لە حونجە کردنی وشەکان دەگریَ و یارمەتیت دەدا لەو خووە خراپە رزگارت بیَ. دوای زیاد کردنی خێرایی خوێندنەوەت پێویستیت بە پەنجەت نامێنیَ. بە جۆرێك کە چاو لە پەنجەکان خێراتر دەجولَیَ.

ئێستا تۆ گەیشتویتە قۆناغی سەرووی تێکست. بەم جۆرە دەگەینە خێراییەکانی زیاتر لە ١٠٠٠ ووشە لە خولەکێکدا.

## تێبینی /

ئەو خێرایی خوێندنەوەیەی کە دەگاتە ١٠٠٠ ووشە لە خولەکێکدا پشت دەبەستیَ بە خوێندنەوەی ڕیز، وە دوای ١٠٠٠ ووشە لە خولەکێکدا خێرایی لاپەڕە دەست پێدەکات، کە چاوی ڕاست ڕیزێك دەخوێنێتەوە و چاوی چەپیش ڕیزێکیتر.

## هەندێك جۆری جوڵەی پەنجە :

١.ئاسۆیی:

لەژێر ڕیزەکەدا لە ڕاستەوە بۆ چەپ، کە تاکو دەگاتە ١٠٠٠وشە لە خولەکێکدا.

٢.ستوونی :

لەسەرەوە بۆ خوارەوە، دوای ٢٠٠٠ وشە لە خولەکێکدا لەوپەڕی ڕاستی سەرەوەی لاپەڕەکە بەهێڵێکی ڕاستدا تاکو چەپی خوارەوەی لاپەڕەکە.

## سێیەم / بەردەوامی و نەگەڕانەوە :

لەکاتی گەڕانەوە و ئاوڕدانەوەتدا بۆ دواوە چاوەکانت وەکو کامێرایەکە کە دەلەرێتەوە، وێنەکەش لەگەڵیدا دەلەرێتەوە. وێنەکە لێڵ دەبێ هەروەها بەم جۆرەش مێشك ناتوانێ پێشوازی لە وێنەیەکی لێڵ بکات کە لە چاوەوە پێی دەگات. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە پێویستە لەسەرمان ئەوپەڕی ڕێگری لە چاو بکەین لە گەڕانەوەی بۆ خوێندنەوەی ووشەیەکی خوێندراوەی پێشوودا.

ئەوە لە خراپترین خووەکانی خوێندنەوەی لەسەرخۆکانە. ئەمەش بە چەند هەنگاوێك لێی ڕزگار دەبین.

هەنگاوەکەی پێشوو ( جوڵەی پەنجە).

بەردەوام بوون لەم خووەدا یارمەتی خێرا وەرگرتنت دەدا کە ئێستا ئەوە باوە. ئینجا خێرایی خوێندنەوە پەیوەستە بە خێرایی وەرگرتن و تێگەیشتنەوە.

جا ئەگەر توانیت ووشەیەك زۆر باش تێبگەی کە لەوەوپێش نەتخوێندۆتەوە پێویست ناکات بگەڕێیتەوە سەری ئەگەرچی وشەکە گرنگیش بێت، نووسەرەکە خۆی لەناو کتێبەکەدا دووبارەی دەکاتەوە. ئەگەر واش نەبوو ئەوا واچاکە بۆ تۆ کە تێیبپەڕێنی چونکە لە چوارچێوەی بابەتەکاندا هەر تێیدەگەی.

ئاگاداری بیرۆکە خراپ و نەرێنیەکان بە، وەکو ئەوەی کە دەڵێن: (هێواش خوێندنەوە لە خێرایی تێگەیشتنت زیاد دەکات). سەرنجت مەخەرە سەر تێگەیشتن. چونکە تێگەیشتن کردارێکە کە دواتر ڕوودەدات.

بەدڵنیاییەوە دوای ڕاهێنانی خێرایی خوێندنەوە پێت دەگات. بۆیە تێگەیشتن بەرهەمێکە لە بەرهەمەکانی خێرا خوێندنەوە.

## چوارەم / سەیرکردنی چەند ووشەیەك لە یەککاتدا :

ئەمە شێوازی پیشەگەر و لێهاتووەکانە لە خێرایی خوێندنەوەدا. لەبری ئەوەی ووشە بە ووشە بابەتەکان بخوێنینەوە، دوو وشە بە دوو وشە دەیخوێنینەوە. یاخود ڕستە بە ڕستە. کە ناو دەبرێ بە ( بازدان لەنێوان ووشەکان )دا.

لەگەڵ تێپەڕینی کات و بە ڕاهێنان کردن خێرایی بازدان بە سروشتی زیاد دەکات.

جێگای خۆیەتی کە باسی سەرۆکی ئەمریکا ( فرانکلین ڕۆزڤێلت ) بکەین کە بەخێرا خوێنەرەوەترین سەرۆکەکان دادەنرێ، تامەزرۆترین خوێنەر بوو:

دەوترێ کە بە سەرنجدانێك بڕگەیەکی تەواوی دەخوێندەوە.

یەکەمین هەنگاوەکانی دەگەیشتە چوار ووشە، پاشان شەش ووشە، ئینجا هەشت ووشە. تا وای لێهات خۆی ڕاهێنا بە خوێندنەوەی دوو دێڕ بەیەکجار، پاشان خوێندنەوەی بڕگەیەکی بچووك بە جوڵەیەکی چاو.

## پێنجەم / سەرنجت بخەرە سەر چیرۆك و دێڕە هۆنراوەکان:

چونکە نووسەر زۆر بە وردی هەڵیان دەبژێرێ، قسەکان ڕوون دەکاتەوە.

**تێبینی** / دوای تەواو بوونی بەشی کتێبێك پێویستە نیشانەیەك لەسەر دوایین لاپەڕە دابنێی کە خوێندووتەتەوە، بۆ ئەوەی بە ئاسانی دەست پێبکەیتەوە، بێ ئەوەی کاتت بڕوا بە هەڵدانەوەی لاپەڕەکان تاکو دەگەیتە ئەو شوێنەی لێی وەستابووی.

## ئەم ڕاستییانەش بزانە :

١. کاتێك فێری خێرا خوێندنەوە دەبی تامەزرۆییت بۆ خوێندنەوەی کتێبەکانیتری کتێبخانەکەت زیاتر دەبێ.

٢. ئێمە کاتێکی زۆر لەدەست خۆمان دەدەین بەهۆی سەیرکردنی ووشەکانەوە لەکاتی خوێندنەوەدا.

٣. چاوەکانت ٢٦٠ ملیۆن وەرگری ڕووناکی تێدایە. ٨٠٪ زیاتری ئەم وەرگرە ڕووناکیانە تایبەتە بە بینینی لاوەکییەوە بە قووڵی، وە ئەوپەڕی بەکارهێنانیت بۆی خێرایی خوێندنەوەت زیاتر دەکات.

٤. بەراوردێك بکە لەنێوان ئەو کاتژمێرانەی کە بۆ خوێندنەوەی ڕۆژنامەکان تەرخانت کردووە لەگەڵ ئەوەی لە ئینتەرنێتدا بەسەری دەبەی، وە هەروەها سوودەکانی خوێندنەوەی کتێب.

٥.ئەگەر بەهرەی خێرا خوێندنەوەت بەدەستهێنا ئەوا ئەقڵت هەڵدەستێ بە داڕشتنی بەرنامەیەکی تێگەیشتنی خێرا کە ماناکان وەردەگرێ. ئەم بەرنامەیەش دانانرێ تاکو ٦٠ ڕۆژ لە ڕاهێنان.

٦.خوای گەورە تێگەیشتنی کردۆتە بەڵگە لەسەر دروست کردن، چونکە بەبێ تێگەیشتن هیچ بیانویەك نیە لەسەر دروستکراوەکان. لەبەر ئەوە ناکرێ مرۆڤێك هەبێ کە هەرگیز تێنەگات بە خوێندنەوە. بەڵام ڕێژەی تێگەیشتن کەم دەکات.

٧.ڕێژەی تێگەیشتنی ئاسایی بریتیە لە ١٥-٢٠٪ لە خوێندنەوەدا.

٨.ڕێژەی تێگەیشتنی لاواز بریتیە لە کەمتر ١٥٪.

٩.چەندە خێرایی خوێندنەوەت زیاتر بێت ئاستی تێگەیشتنت زیاتر دەبێ.

١٠.ئەوە بزانە کە لەگەڵ بەردەوامیت باشتر دەبێ.

١١.خوێندنەوەی لەسەرخۆ بەرەو بێزاریت دەبات. ئەقڵت هێواش دەکاتەوە و تێگەیشتنت هێواشتر دەبێ.

١٢.چەندە زیاتر بخوێنیتەوە بەهرەی زمانەوانیت زیاتر دەبێ، خێرایی خوێندنەوەت زۆتر دەبێ چونکە تێگەیشتنت بۆ دەق زیاتر دەبێ.

١٣.گەڕانەوەت بۆ ووشە خوێندراوەکان نیشانەی کەم سەرنجیتە لەکاتی خوێندنەوەدا.

١٤.پێویستە خێرایی خوێندنەوەت جیاواز بێت بەپێی ئەو بابەتەی دەیخوێنیتەوە و ئامانجی تۆ لە خوێندنەوەدا، بۆ نموونە خێرایی ئۆتۆمبێلێك جیاواز دەبێ بەگوێرەی قەڕەباڵغی ڕێگاکان.

١٥.لەسەرەتای فێربوونی خێرا خوێندنەوەدا وەکو هەر ڕاهێنانێکیتر دەناڵێنی بەدەست ماندووبوونی چاوەوە، چاریش نیە هەر دەبێ ماندوو بێت.

١٦.ناوچەی بینینی چاوی مرۆڤ زۆر فراوانە.

١٧.ئەوەندە بەسە کە ٢٠٪ ئەو بابەتەی دەیخوێنیتەوە تێیبگەیت ، ٨٠٪ ش زۆر پێویست نیە.

١٨.ڕێژەی مامناوەندی ڕیزەکان لە زۆربەی کتێبە گەورەکاندا کە چاپکراوە ١٨ ڕیزە.

**١٩.هەندێ لە زانكۆ جیهانیەكان مەرجی ئەوەیان هەیە لەسەر ئەو كەسەی چۆتە زانكۆ كە خێرایی خوێندنەوەی كەمتر نەبێ لە ١٠٠ ووشە لە خولەكێكدا.**

**٢٠.هەندێك لە ئەنجامەكانی ڕاهێنانی خوێندنەوەی خێرا :**

**ئەگەر ٦ هەفتە لەسەر یەك ڕاهێنانت كردبێ، بەویستی خودا بەرزترین خێرایی خوێندنەوەت بەدەست دەهێنی وەكو :**

| ڕێژەی ڕۆژانەیی بۆ خوێندنەوە | ڕێژەی چاوەڕوانكراوی خێرا خوێندنەوە |
| --- | --- |
| ٢٠ خولەك | ٣٠٠–٦٠٠ ووشە لە خولەكێكدا |
| ٤٠ خولەك | ٦٠٠–٨٠٠ ووشە لە خولەكێكدا |
| ٦٠ خولەك | ٨٠٠–١٠٠٠ ووشە لە خولەكێكدا |
| ١٢٠ خولەك | زیاتر لە ٢٠٠٠ ووشە لە خولەكیگدا |

**خشتەی چاودێری بۆ بەرەو پێشچوونی خێرایی خوێندنەوەت :**

| ژمارە | ڕۆژ | بەروار | كاتی خوێندنەوە | ژمارەی ووشەكان | خێرایی خوێندنەوە |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| 1 | | | | | |
| 2 | | | | | |
| 3 | | | | | |
| 4 | | | | | |
| 5 | | | | | |
| 6 | | | | | |
| 7 | | | | | |
| 8 | | | | | |
| 9 | | | | | |
| 10 | | | | | |
| 11 | | | | | |
| 12 | | | | | |
| 13 | | | | | |
| 14 | | | | | |
| 15 | | | | | |
| 16 | | | | | |

# بەشی چوارەم

## ڕاهێنان لەسەر خێرا خوێندنەوە

### بەڕێزم :

ئەمە دەقێکە لەبەردەستتدا بۆ ئەوەی خێرایی خوێندنەوەتی بەسەردا جێبەجی بکەی. دوای ئەوەی کە بنەماکانی شارەزا بوویت پاشان لەگەڵ سەرەتای خێراییەکەی پێشووت بەراوردی بکە لەگەڵ ئاگادار بوون لەو ژمارانەی کەوا لەناو ئەم نووسراوانەدا هەیە. ئەوەش بۆ ژمارەی ئەو ووشانەی کەوا خوێندراونەتەوە لەپێشتردا.

دەقی یەکەم

من سەرکەوتنەکانم بەدەست دەهێنم

لەپڕێکدا خۆم بینیەوە کە بەرپرسیارم لەماڵێك و سێ کەس کە پێویستە ڕۆژانە ٣ ژەمە خواردنیان پێ بدەم. بەڵایەك کە لە سزادان دەرچوو بوو، وام هەست دەکرد لەنێوان دوو هێڵی بەیەکداچوو دام کە نە سەرەتای دەزانم و نە کۆتایی. هەموو شتێك بەخێرایی ڕوویاندا.

لە خەوێکی قووڵ دا بووم کە هەستم بە دەستێك کرد لەراندمی. ڕووی درەوشاوەی دایکم بینی کە لەناو وون بوونە قووڵەکەی خۆمدا بووم. بەخێرایی لێوەکانی جوڵاند و پێی وتم :

من بۆ ماوەی یەك هەفتە گەشت دەکەم، پێویستە تۆش گرنگی بە ماڵەکە و باوکت و برا و خوشکەکەت بدەی.

نەمدەزانی و بگرە هەستم بەو زیادەڕەویەی نوستنم نەدەکرد. تاکو بەڕاستی لەخەو هەستام و کاتژمێر ١٠:٣٠ بوو. لەو کاتەدا چاوەکانم دەخوراند و دەمووت خۆزیا ئەوەی دەیبینم خەو بێت.

لە جێگاکەی خۆم بازمدا و بەبێ هۆشی ڕێم گرتەبەر بەرەو ژووری دایکم.

پاشان بۆ ناندینەکە، ئینجا سەیری باخچەکەم کرد، هەموو ئەنجامەکان ئاماژەیان بەوە دەدا کە بەڕاستی دەبێ من بەرگەی ئەمە بگرم.

چۆن دەبێ ؟

ئاخر من چۆن بەرپرسیاریەتی ئەم حاڵە هەڵبگرم؟ هیچیش دەربارەی بەڕێوەبردن و بەرپرسیاریەتی نازانم؟

**زۆر بەناز و بەخۆشی و نیعمەتەوە ژیابووم، خواردنم بۆ ئامادە دەکرا. هەرکاتیك داوای جل وبەرگم دەکرد بەڕێکوپێکی دەهاتە بەردەستم.**

**هەرچۆنێکی ویستبام دەخەوتم و هەڵدەستام، شەوانە بەدیار تەلەفزیۆن و مۆبایلەوە تا درەنگان دەمامەوە. ئێستا هەموو شتێك گۆڕاوە.**

**ئای دایکە! چۆن پشت بەمن دەبەستی کە من شیاوی ئەم شتانە نیم؟**

**بەخۆم وت :**

**باشە (سۆنیا)ی خزمەتکارمان هیچ کاتێکی نەدۆزیەوە ڕابکات ئێستا نەبیٚ؟**

**ئەگەر ئەو لێرە بووایە ئەم بارگرانەی لەسەر شانم لادەبرد و لەم کێشەیە ڕزگاری دەکردم.**

**جا بەختم هەبوو کەوا لە کاتی پشووی خوێندنگادا بووم ئەگەرنا کارەساتەکە گەورەتر دەبوو.**

**بۆ ماوەیەك لەسەر کورسی دانیشتم. جارێك دەمڕوانیە ناندین و جارێکیش بۆ بنمیچەکە و جارێکیش بۆ ژوورە چۆلەکەی دایکم دەڕوانی.**

**نەمدەزانی لەکوێوە دەست پیبکەم؟!**

**پێیەکانم بەبێ ویستی خۆم بەرەو ناندینەکەی بردم. چوومە ژوورەوە بەلاٌم وامزانی دەچمە نیشتمانێکی نامۆوە بەخۆم.**

**سوپاسی خوام کرد کە دایکم ئەوێی بەپاك و خاوێنیەوە جێهێشتبوو پێش ئەوەی بڕوات ئەگەرنا من بەژیانی خۆم ئیسفەنجی پاککردنەوەم دەست لیٚ نەدابوو. هەر نەمدەزانی چۆن چۆنی قاپەکانیش بشۆم.**

**ئەم نەزانیە چیە هەی ماڵوێران ؟**

**توخوا شەرم ناکەی کە ١٦ ساڵیت و هێشتا هیچ شتێك دەربارەی ماڵداریش نازانی؟**

**هی وەك تۆ ئێستا شوویان کردووە و منداڵیان هەیە، تۆش هێشتا خۆت بە منداڵ دەزانی؟**

**یادت بەخێر داپیرە گیان، تۆ هەمیشە ئەو وشانەت بەگوێی من دادەدا و هەمیشە تۆم بە زەردەخەنەوە دەبینی، بە ڕوویەکی خۆشەوە لەناخەوە ئەم قسانەت دەکرد کە من بە کەلەپورێکی لەناوچووم دادەنا.**

لەرینەوەی کاتژمێر لە هۆڵەکەدا بیرۆکەکانمی پچڕاند. پێی ووتم کاتژمێر ١١ی نیوەڕۆیە.

ئای خوایە،خواردن !

کێ ئامادەی دەکات؟ مەعقولە من بم ؟

من لە ئامادەکردنی خواردندا شارەزاییم نیە، تەنانەت بیبەر و بەهارات و...هتد لێك جیا ناکەمەوە. خۆ نازانم دایکم ئەو شتانەی لەکوێش دانابوو؟

شتێك بەمێشکم داهات کە ڕزگاری کردم لەهەموو ئەوانە. تەلەفۆنم بۆ باوکم کرد و داوام لێکرد خواردنمان بۆ بکڕێ. بەڵام هەوڵەکەم بێ سوود بوو چونکە وەڵامی نەدامەوە. وەك بڵێی باوکم سوربێ لەسەر ئەوەی کە من ئەم ڕۆڵە ببینم. ئێستا چی بکەم؟

هەمووان چاوەڕێی شتێکی من دەکەن، چونکە من گەورەم. لەناکاو نامیلکەیەکم وەبیر هاتەوە کە تایبەت بوو بە ڕێکوپێککردنی ماڵ. ئەم لیستە هی ماموستایەکی هونەری چێشتلێنان بوو کە وانەکانی تێدا تۆمار کرابوو.

گەڕام و سوڕام هەتاکو لەنێو دەفتەرە زۆروزەبەندەکاندا دۆزیمەوە.

پەڕەکانم هەڵدایەوە. نا ئەمە نیە..ئەوەش نیە...

ئەی خودایە، هەموو ژەمەکان پێویستی بە هەوڵدان هەیە، تاکو لە کۆتاییدا دانەیەکی گونجاوم هەڵبژارد.

بەڵێ (توست بە مریشك) ، ژەمێکی باشە. بەڵام کێشەیەك هەیە، مریشکیش پێویستی بە پاککردنەوە هەیە. باشە دەیگۆڕم بە شتێکی سوکتر. با ( توست بە پەنیر ) بێت. زۆر گونجاوترە. لانیکەم (توست) ئامادەیە و هەروەها پەنیریش.

لەگەڵ ئەم ژەمەدا چینێك شیرنەمەنی دادەنێم. با ( جەلی بە میوە) بێت.

ئەوەی دواییان هیچ پێویست بەمن ناکات. تەنها ئاوی دەوێت لەگەڵ هەندێك پارچە میوە و کیسەیەك جەلی.

چوومە ناندینەکە و دەرگاکەم لەسەرخۆم داخست.

دەستم کرد بە تەق و هۆڕی قاپەکان و دەتووت لە مەیدانی جەنگم.

دوو کاتژمێری خایاند تاکو تەواو بووم. ژمارەی قاپە بەکارهێنراوەکان بۆ ئێوە بەجێدێڵم، دەتووت داوەتم ساز کردووە.

باوکم، کاتژمێر ١:٣٠ لەکار گەڕایەوە. چووە ژوورەکەی خۆی، وەك بڵێی هیچ شتێك نەبووە. جلەکەی گۆڕی و داوای لێم کرد خواردنی بۆ ببەم و بانگی (**سعاد و سوڵتان**) یش بکەم.

بەڕاستی دوودڵ بووم لەوەی خواردنەکەیان بۆ ببەم کە بەدەستی خۆم دروستم کردبوو.

وێنای ئەو ڕوانینانەیانم دەکرد کە بۆ خواردنەکە دەیانکرد. بەڵام کۆمەڵە بەهانەیەکم هێنایەوە بۆ کەم وکوڕی و هەڵوێستەکانم.

باوکم بەبێ دەنگی نانی دەخوارد و سەیری تەلەفزیۆنی دەکرد. بەڵام (**سعاد و سوڵتان**) ناوبەناو بۆڵەبۆڵیان دەکرد و بە نۆرە پلاریان دەهاویشت.

(ئۆف !! چەندەم ڕق لە پەنیرە **سوڵتان**) ، ( بەژیانی خۆم وەکو ئەو ژەمە خواردنە چەورەم نەخواردووە سعاد).

منیش بە ڕقەوە سەیم دەکردن، گوتم هەر سزاتان دەدەم بەڵام با نانخواردن تەواو بێت.

چوار ڕۆژ تێپەڕی کرد، دەتووت چوار ساڵی سەرەوژێرم بەڕێکردووە. لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکیتر .

هەستم کرد کە من ساڵەوساڵ گەورەتر بووم. تێڕوانینم بۆ ژیان گۆڕاوە. بەباشی هەست بە جددیەت و بەرپرسیاریەتی دەکەم. دەرکەوت کە چۆن دەکرێ مرۆڤ تورە بێت لە کاتێکدا هەموو ڕۆژەکەی بە ڕێکخستن و پاککردنەوە بەسەر ببات؟

(**سوڵتان و سعاد)** ئەوەیان لەگەڵم دەکرد، تەنانەت ئامۆژگاریش کرابوون لەسەر ئەوە.

خۆم وەبیر هاتەوە کە چەندە کەللەڕەق بووم لەگەڵ دایکی خۆشەویستم. ئاااای دایکە! ئێستا هەست بە تۆ دەکەم.

کاتێك لە بەرەبەیانی زوو هەڵدەستم و ئیش وکار دەست پێدەکات.

نانی بەیانی ئامادە بکە و ئینجا دەست بکە بە پاککردنەوەی ماڵ و پاشان نۆرەی نانی بەیانی دێت. ئینجا شوشتنی قاپ و قاچاغ و ڕێکخستنی جلوبەرگ و ئینجا نانی ئێوارە.

ڕۆتینێکی دووبارە کە ماندووی دەکردم بەڵام ماندوو بوونێك وای لە دەروونم دەکرد هەست بە ڕەزامەندی و باوەڕ بەخۆ بوون و دڵخۆشی بکەم.

هەستم دەکرد کە بەڕاستی من ئێستا کچێکی گەورەم، لەماوەی ئەم چەند ڕۆژەدا شتگەلێکی زۆر فێر بووم. ( ئوم بەدر) ی جیرانمان لە ئیش وکاردا هاوکاری دەکردم، لەگەل ئامادەکردنی هەندێ ژەمە خواردنی خۆش بۆ خێزانەکەم.

لە بەرەبەیانی ڕۆژی شەشەمدا، ژووری باوکم ڕێکدەخست، لەکاتێکدا (**سعاد و سوڵتان**) لە هۆڵەکەدا زۆر سەیر یەکیان گرتبوو و لەنێوانیاندا ئاشتەوایی ڕوویدابوو. سوپاسی خودام کرد لەوەی کە ئارامی باڵادەست بوو.

دەمارەکانم خاو ببونەوە، هەستم بە سۆزێکی گەورە دەکرد بۆ دایکم و ئارەزووی توندم هەبوو بۆ باوەشی.

دڵخۆش بووم بەو گۆڕانەی کە بەسەرمدا هاتبوو، بەداخ بووم تاکو دایکم بمبینێ کە بوومەتە مرۆڤێکی باش. هەستم بە بوونی دەکرد لەهەموو شوێنێك. گوێم لە ووشەکانی دەبوو، وەهەروەها هەڵسوکەوتەکانم لەگەڵیدا، هیوام دەخواست هەر ئێستا بهاتبایەوە بۆ ئەوەی ببمە کچێك (بەڵکو خزمەتکارێك)ی گوێڕایەڵ، لەناکاو گوێبیستی دەنگێکی بەرز بووم! لە بیرکردنەوەدا ڕاپچڵەکاندم و وای لێکردم بەخێرایی بچمە دەرەوە.

بینیم (سعاد) لەسەر زەوی هۆڵەکەدا پێچراوەتەوە و خوێن دەم وچاوی داپۆشیوە، (**سوڵتان**) یش بەدیاریەوە وەستاوە و بەترس ولەرزەوە سەیری دەکات.

هاوارم کرد بەسەریدا و (سعاد)م گرت. وتم چی بووە ؟

وتی : باوەڕم پێ بکە خەتای من نەبوو.

پێم ووت خێرا قسە بکە. لە قسەکانیەوە زانیم کە (سعاد) بەسەر کتێبخانەکەدا سەرکەوتووە تاکو بگاتە کاتژمێرە بەرزەکە. بەڵام کەوتووە و سەری بەر قەراخی مێزەکە کەوتووە.

تووڕەیی و ترس و دڵەراوکی داگیریان کردبووم، نازانم چۆن بوو خودا ئەوەی خستە دڵمەوە کە لەسەرخۆ بم و بەرگە بگرم.

بردمە نەخۆشخانە، دکتۆرەکە دڵنیای کردمەوە کە برینەکە سادەیە و تەنها دوو تەقەڵی دەوێت.

گەڕامەوە ماڵەوە و پەرێشان بووم، خەریك بوو ئیدی ئارامیم نەمێنێ. خۆزیا لێرەدا تەواو بووایە، بەڵام (سعاد) تایەکی توندی گرت و لەسەر جێگا کەوت.

دەبوایە شەو و ڕۆژ لەلای بام.

بۆ یەکەمجارم بوو کە لە خەوی خۆش بێ بەش بم و دەبووایە ئاگاداری بم.

بۆ یەکەم جارم بوو کە هەست بکەم وەك کەسێکم کە جەستەی هیلاك و ماندووی پارچە پارچە دەبێت بەڵام ناتوانێ بخەوێ لە ترسی نەخۆشی.

ئای خودایە چۆن پێشتر دەمتوانی وا بژیم!

ئەوسا بێ باك بووم لەوەی كێ نەخۆش دەبێ و كێ ساغە و كێ دەڕوات و كێ دێت، هەموو ژیان لەدەوری خۆمدا بوو. تەنها من و ئەو شتەی دەمویست.

دایكە گیان، ئەی ئەو دڵەی پڕە لە بەخشین. دەكرێ بەرگەی هەموو ئەو شتانە بگریت و هیچ نەشتبینم كە گلەیی و گازاندەش بكەیت؟

چەندە شەرمم لەخۆم دەكردەوە كاتێك بیرم لە تەمبەڵی و زمان درێژی و كەللەڕەقیم دەكردەوە؟

چەندجار بە ئازادیەوە هاوارم بەسەرتدا كردووە ئەی دایكی خۆشەویستم. چەندە كەسێكی لاسار و بەداوا بووم لە خواردن و جلوبەرگ و كێشەم دروست دەكرد بۆ ئەوەی خۆم بسەلمێنم.

سەرم شۆڕ بوویەوە بەسەر سنگمدا بەهۆی قورس و گرانی و زۆر هیلاكی. هۆشم لەخۆم نەبوو تاكو دەستێك بەهێواشی جولاندمی و ڕووی خۆشەویستی تێكردم!

دایكە ئەوە تۆی؟

–بەڵی خۆشەویستەكەم، دەی بچۆرە ژوورەكەت .

كەی هاتیەوە دایكە؟

–كەمێك پێش ئێستا كە باوكت باسی (سعاد)ی بۆ كردم.

دایكە دڵ لەدڵ مەدە، باش ئاگام لێیان بووە كە تۆ لێرە نەبوویت.

–گومانم لەوە نیە گیانەكەم.

وامزانی ئاوێكی سارد ناخمی فێنك كردەوە و ژیانی وەبەر هێنامەوە. هەستم بە ئۆقرەیی و ئارامی كرد، ئاسایيش بەسەر دلمداهات. زانیم كە من بەبێ ئەم دایكە گەورەیەم هیچ نیم.

ئینجا پاشی چەند هەفتەیەك زانیم كەوا ئەوەی پێشوو هەمووی ڕێكەوتن بوو لەنێوان باوانمدا!

بۆ ئەوەی بەكرداری بەرپرسیاریەتی هەڵگرم و وانەی لێوە فێربم.

بەڕاستی هەفتەڕاهێنانێكی ڕاستەقینە بوو كە من بە پلەی نایاب لێی دەرچووم.

# بەشی پێنجەم

## شێوازی هەڵدانەوەی لاپەڕەکان پێش خوێندنەوەی هەر کتێبێك

ئەمە بە مانای خوێندنەوەیەکی گشتیە پێش دەستکردن بە خوێندنەوەی. بۆ ئاسانکاری خوێندنەوەی خۆت.

**شێوازی هەڵدانەوەی لاپەڕەکان بەم جۆرەیە :**

دەست بەسەردا گرتنی کتێب :

١.دەرەکی : هەڵگێڕانەوەی لاپەڕەکان بەهۆی پەنجەکانەوە لەلای سەرەوەی چەپی کتێبەوە.

٢.کردنەوەی هەر ١٠ لاپەڕەیەك لە کتێبە دەرەکیەکە و ئەوانیتریش لەلاکەیتر.

*سەیری شێوەی بەرگی دەرەکی بکە :

ڕوانینی وێنەکە و خوێندنەوەی ناونیشان بەشێوەیەکی باش، ڕێگای دەرخستنی کتێب، قەبارەکەی و ڕەنگەکەی.

*پێڕستی ناوەڕۆکەکەی بخوێنەوە:

تێبینی ڕیزکردنی بەشەکان و خوێندنەوەی بەشێوەیەکی گشتی. بۆ نمونە ئەگەر یەکێك مەبەستی خوێندنەوەی کتێب بێت ئەوا :

دەستخستنی زانیاریەکی دیاریکراو، لەبری ئەوەی هەموو کتێبەکە بخوێنیتەوە لە ڕێگای پێڕستی کتێبەکەوە شوێنی ئەو زانیاریانە دەزانی. بەمەش کاتی پێویستی بۆ دەگەڕێتەوە.

*پێشەکیەکەی بخوێنەوە :

ئەم هەنگاوە، لەدوای خویندنەوەی پێڕستەکەیەوە دێت. لەکاتی خوێندنەوەی پێشەکیدا ئامانجی کتێبەکە و شێوازی نووسینەکەیمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە کاتی بەردەستمان بۆ فەراهەم دەکات لە گەڕانیدا.

*هەڵدانەوەی ناونیشانە سەرەکیەکان:

چۆنیەتی ڕیزکردنیشی لە کتێبەکەدا بزانە.

*کورتەی هەموو بەشەکانی بخوێنەوە لە کۆتاییەکەیدا (ئەگەر هەبوو)، یاخود پوختەکەی لە کۆتاییەکەیدا.

ئەو کارانەی یارمەتیت دەدات لەسەر جێگیر بوونی ئەو زانیاریانەی کە دەیخوێنیتەوە لە کتێبەکاندا.

**دەستنیشان کردن :**

ئەمەش واتا هێڵێك بەژێر ڕستە سەرەکیەکاندا بێنە بە (قەڵەمدار) یێك لەگەڵ شتە گرنگەکاندا.

دەشتوانی لەبری قەڵەمەکە ژمارەی لاپەڕەکە لە یادخەرەوەیەك بنووسی لەکاتی تەواو بوونی خوێندنەوەی کتێبەکە.

هەروەها بیر وهۆشت دووبارە لەسەر ئەم بابەتانە ڕابێنیتەوە.

**کورتە :**

ئەمەش واتای نووسینی بیرۆکە سەرەکیەکانە (تەنها) لەم کتێبەدا.

لەم لایەنەوە دەمەوێ ئەزموونی کەسێکتان بۆ باس بکەم:

لەتەواوبوونی خوێندنەوەی هەر کتێبێکدا، هەر زانیاریەکی ناو کتێبەکە کەوا سودی لێ بینیبوو دەینووسیەوە لەگەڵ خاڵە سەرەکیەکانی ناوی .

وە ئەو بڕگانەی کەوا نەیدەویست لەبیری بچێتەوە. ئەم کاغەزەشی دەپاراست لەلای خۆی بۆ ئەوەی هەر کاتێك پێویستی پێی بوو بەخێرایی بێتە بەردەستی و کاتی لێ نەڕوات.

**ئەوەی گرنگە :**

*دەبێ خوێندکار هەمیشە کاغەزی پێبێت بۆ نووسین، جا دانیشتوو بێت یاخود ڕۆیشتوو.

***خليل ابن احمد  دەڵێ : هەر کەسێك شتێك لەبەر بکات وەدەستی خست، وەهەر کەسێك شتێکی نووسی جێگیری کرد.**

***کەسێك وتی : ئەگەر گوێبیستی شتێکی سەرنجڕاکێش بوویت بینووسە کە بەدڵتە.**

***یەکێك لە ئەدیبەکان ووتی :**

**بۆم دەرکەوتووە کەوا ئەهلی ئەدەب جوانترین شتێك کە بەر گوێیان دەکەوێت دەینووسن، جوانترین نووسینەکانیش لەبەردەکەن و بەجوانترین لەبەربووەکانیش قسە دەکەن.**